«ئەوین»

گوڵم!
دڵم پەردەی بێدەنگی شەوەزەنگ
ئەدڕێنێ
چاوم،
تارمایی بومە لێڵی ئێوارەیەکی درەنگ
ئەرەتێنێ
لێوم،
خۆشەویستی و ئەوینی دڵ
ئەدرکێنێ
فیکرم،
بۆ ئامێزی گەرمی تۆ، هەروەکوو هەڵۆ
ئەقڕیوێنێ

٧٠/١/١٤

«خاتوونی من»

لەگەڵ خۆر ئاوا بوونی هەر ئیوارەیەک
چاوی حەزم بۆ ژوانی تۆ
خاتوونی من
ئەبڕمە بەر درگاکەتان
چاوەڕێتم،
لەگەڵ خشپەی پێی ڕێبواران
لەگەڵ چرپەی هەر گەڵایەک
لەگەڵ شنەی هەر شەو بایەک

چاوەروانم
بەروانینی گوشەداری چاوەکانت
وەکو هەتاو بۆ ئاسۆی ژین
یشک باوێی.
٧٠/٣/١٥

«خۆشەویستی»

دڵم ئەکەم بە گۆی زەوی
چاوەکانم فەرشی ڕێگات
دەستەکانم بۆ پردە باز،
هەم بۆ کایە و
هەم بۆ هاوڕاز
تا بە سەریا بێی و بچیت
نەوەک دڕک و داڵی زۆردار
توشت بکا ڕێی ناهەموار

٧٠/٣/١٩

«وینە»

لەسەر دوندی چیای سەرکەش
لەگەڵ خۆر وێنەت ئەبینم
شەڕ ئەکات و
بە نیگای پڕ لە سیحر و ناز
کایە بە شێعری هێشتا باڵ نەگرتووی
ئەم کاتەم ئەکات
ئەبینم پەنجەی زێڕینت
سێ بەندی دڵم دەپسێنێو
تاڵی مووت جێگیر ئەو دەکات.
٧٠/٣/١٩

«مزگێنی بەهارێکی بێ بڕانەوە»

گوڵە گەزیزە شۆخەکەم!
کەبۆنی بەهارت کردۆتە مزگێینی
بۆ ژیان
بۆ زیندو بونەوە و هەرمان.
من دەرانم کە پەیامی ژیانەوەی
وەزەکانت
بە شاپەرەوە لکاوە.
خۆزگە منیش
بمتوانیبا جارێک وەک تۆ
- تەنیا جارێ -
مزگێنێ بەهارێکی وا
بێ بڕانەوەم
لەگەڵ شەپۆلی بی سنوور
بە دیاری بۆ بهێنایەن.
ئەوسا منیش
وێنەی تۆ کرنۆشم دەبرد
بۆ سروشت و جوانی وڵات.
٧١/١٢/١٢

«هەڵپەرکێی پەپوولە»

هەڵپەرکێ و شادی پەپولە
بەدەوری مۆما
لە خۆشەویستی و ئەوینی پاکێتی
کەچی گڕی تێبەر دەداو
دیسووتێنێ
ئەیکا بە تین،
بە کۆی زوخاڵ
بهڵام وەفادارە لەسەر
پەیمانی خۆی
ئەو پەپولە باڵ ڕەنگینە
باڵ ئاگرینە
پێدەکەنێ و
دڵ خۆش بەوەی
کرنۆش ئەبا
بۆئیلاهەی جوانی و ئەوین
گیانی بەخت ئەکا لەرێگەی ئامانجی
بەرز و شیرین.
٧٢/٤/١١

«ژیانەوە»

لەکانگای پرهێزی هیوا
گەڕانەوە، ژیانەوەیە
لەوەرزی پێک گەیشتنا
گوڵ نەشئەیە
شکوفەی ئەشقێکی شیرین
بۆ یادگاری
بەرێوەیە.
دار بە ڕوی کوێستانی دڵم
لە بۆن و بەرامەی وەرزی
نۆیدا
بۆ توولە نەمامی شلکی
وا خەریکی بەر هێنانە
ئەوەش رەوتێکی سروشتە و
دیاردەیە بۆ من و تۆیە.
هەوێنی گیانی دار بەڕو
بۆ ژیانێکی سەر بە خۆ
هەر چڕۆیە!
٧٢/٣/٧

«باغی هەتاو»

ڕێگا دووره
ڕژد و هەڵدێر، بێ سنووره
لوتکه و بەر بەیان
پێشەنگن
بۆ ئەزمون و
تەقڵە لێدان
دەبا بئاژوێ و سڵ نەکات
ئەسپی خۆش ڕکێفی هەنگاو
بۆ سەر لوتکە،
بۆ گەیشتن بە ڕوناکی و
باخی هەتاو.

«ڕەشە داڵ»

داڵی برسی و چاو جنۆک
دەڕوانێتە ژێر باڵی و
چاوەڕییە بۆ مەرگی ئەویندارانی ژیان
کە جستەی خەستە پڕ لە
رازیان بکاتە تێشوو
بۆ چەن ساتێکی ژیان.
٧٣/٤/٢٤

«روان»

تۆوی خۆشەویستی بووم من
بە رێژنە بارانی عەشقت
سەرم هەڵدا
کەسینگی مێژووم هەڵدڕی
پێم لە دونیای ئەوینت نا...
لەو رۆژەوە
کەلە پێدەشتی سینگتدا
چارشێوی
عەشقی پیرۆزتم دا بەسەردا
ئەویندارم....
ئەویندار...

«زامی دەروون»

لە ژێر پەردەی راز و تەما
کێ ئەزانێ،
ئەم دڵەی من بۆ بە خەمە؟
لە زیندانی سینەی شەودا
لە قەفەسی بلورینا
بە لێدان و دڵە خورپەی
لە نێو تەم و تاریکیدا
لە بەرچاوی دەهاژێ و
درێژە بەرەوتی ژینی ئەدا
کێ ئەزانی،
لە ژێر باڵی رەشی شەودا
چیها فرمێسک - دڵۆپ، دڵۆپ
یا بە رێژنە -
لە چاوی خەم دێنە خوارێ؟
بەڵام هاورێ
رۆژێ دادێ
زامی دەروون بە ئارەقەی
سوێری ئەم پاییزە سوورە
سارێژ دەبێ و دا دەمرکێ
٧٠/١٢/١٦

«ئاخ» (بۆ هاوڕێی جوانه مەرگم «ئارام» شاعیری بەهار و ئەوین)

ئاخم بۆ تۆ..
گوڵاڵەکەی خوێن و هەتاو
خۆزگە دەمزانی
بە دەستی کامە گژە با
دەماری پڕ خوینی گەرمت
تەزووی ژاکانی تێچزا؟
هۆ... سەمفۆنیای عەشق و ئەوین
ئەی ئەوکەسەی وەک فریشتە
باڵی فرینت کردەوە و
شا باڵت لەخمی شینی گلێنەی ئاسمان هەڵکێشا.
کە دەنگی جوامێرانەت وەک بروسکە وڵاتی داگرت
ئاسمانت بۆ کەوتە هاوار
بەڵام .. بەڵام
نەیتوانی تنۆکێک باران ببارێنێ،
جەستەی زامار و ژاکاوت
لە قاقڕی تینوێتی دا
لە نێو جۆلانەی دڵوپێک دا بنوێنێ
ئاخم بۆ تۆ...
ئاخم بۆ تۆ...
٧١/٣/١٧

«قوربانی»

هەر کە ئاڵقەرێزی درگات ترازاند و
دەروازی ماڵت کردوە و
لە بەر پێتا قومبەلەیەک تەقییەوە
هەراسان مەبە ئەگەر رامچڵەکاندی
دڵگیرمە بە
ئەگەر بە پڕژاندنی دڵۆپە خوێنێ
وێنەی رازی خۆمم لە سەر لاپەڕەی کوڵمە
نەخشاندی.
دڵگیرمەبە ئەوە دڵمە جێم هێشتووە، لە جێژوانت
لە بەر تیشکی خۆری رووتا
خۆی رانەگرت
گیانی داو بوو بە قوربانت

٧٣/٢/٥

«زەماوەند»

گوی... ها دەنگ دێ
لە ئەو پەری نەمانەوە
لە دەشتی کاکی بە کاکی
لە گهڵ شەپۆلی نەسرەوتن
گوێم لە دەنگی
زرینگە زرینگ و
زیل و بەزمی کاروانێکی
بێ پسانەوە بە رێوەیە
سەر قافڵەکەی، زاوایەکی لە بەر دڵان،
ئێسک سووک و
ئاشتی خوازە
خۆشەویستی ئەستێرانە
گش کاتی ژیانی سەوز پۆش
بۆ ژییانە
بووک، گزینگی خۆرەتاوە
هەموو رۆژێ
سە لە بەیان تا ئێوارێ
دانیشتوانی ئەم هەرێمە
دەیانەوەێ
بە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا و
رمبارزێی و تەقڵی و هەو هەوی
شۆڕە سواران
بە گەڕی داوەت و سەما
بێگویزنەوە

«پەیکەرەی هاوار»

لە شارێکی پڕ لە غوربەت
چاوم بە دیمەنی ناسیاوی پەیکەرەی
هاوار کەوت
بیر و هۆشم
تەنانەت تان و پۆی لە شیش
ئاوێتەی هاواری ئەو بوو
دەستە هەڵبراوەکانی
خستە ناو دەستی زامارم
هەتا هێزم لە گیاندا بوو
پڕ بە گەروم
هاوارم کرد.
بۆ چەند چرکەیەک، تێم راما
چاوەکانی
لە چاوەروانی ئەو تۆدا
سپی ببوون
پێیان ووتم
تۆ کوڕی ئەو هاوارە، نی
لە بەستهڵەک و سەرمای ژینا
چەماوییەوە
چاوەکانت
لە چاوە روانیدا لێڵ نەبوون بەرێوە!
بهڵێ کاکی پەیکەر تاش
هاتم بۆ شاری تەم گرتووت
شاری لە ناو رکەی ئاسن

ئەدرەوشاوە
هێندی تریش
هاواری لێ بەرز بۆوە
پەیکەرە کەت
کەچی
هیچ کەس نەبوو کە بێ دەنگیەوە
شەپۆلی بە سامی دەنگی
لە نێو بریقە و زروقەی
دوو روییدا
نرکەی ئەهات.
هاتم ئەم شارەی گەروی وەک بلوێری شوانان بوو
بۆ دەربڕینی هاوارمان
بەڵام!
لە جیات هاوار
خەویکی وا سارد و نامۆ
شارەکەتی گرتبوە باوەشی...
ئاخۆ!؟
هاواری‌یە یکەرەت
دەگاتە گوێ
بۆ هەستان و
راسانی نوێ
٧٤/٧/٩

«ئاواتە خنکاوەکان»

پێشکەش بەم گەورە کچانەی کە خۆیان
لە ناو تاو ئازار و ئەشکەنجەی دەرونی سووتاندو
هاواریان لە گەرودا قەتیس ماو ، لە بەستێنی
سەخڵەتی ژینا ئارەزووەکانیان سووتاند و بۆ کڕوزی
هەر لە ناو مێشک و گەرویاندا ما.
بەڵێ پێشکەشە بەم گەورە کچانەی
کە دەنگی هاواریان بەردی شەق کرد
بەڵام کوا گوێی بیستن... کوا؟!
لە نێوان زام و ئازار لە گاژوم کرد
لە دەس هاوارە قەتیە کانەوە
چەکەرەم دا
لە گەل زەردەی خۆرا بۆ ژین
پەیمانم بەست
شین بووم و سەوز هەڵ گەڕام
لەگەڵ گزنیگا تێک ئالام
هانای هەناسەم بەگوڕتر دەبوو هەردەم
کاروانی رووباری دڵم
بەنیو دەمارە کانمدا سووڕی ئەدا
من بە زەردەی رۆژی دەم کەل
ناشتام دەکرد
بۆژوانی تریفەی مانگ
کاتم ژمارد
لەگەل شنەی کازێوە دا
لەنێو خرمانەی گوڵانا

کایەم دەکرد
سیرە سیری سێوەرە بوو
لەبەر پێما عەتری بۆن خۆشی
بیرەوەریان دەپرژاندە نێو هەناوم
ئای کە چەندم حەز لە کولکە زێڕینەیە
تیشکی چاوانم خۆلەکە وانەی سێحری
رەنگە کانی بگالێنێ
هەتا پێی رابگا دەستم و
لە چینگ ئازاری کچێنیم رزگاریم بێت ١
منی لە ناو حەڵقە، حەڵقەی زەنجیر کونی یاساکانا
شەتەک دراو
بیرم لە ناو ژەنگ و ژاری
ئەفسانەی ئازادیدا
سەرگەردانە
دەمەوێ بۆ دەرباز بوونم
بە کامی گەورەترین ئازار رۆچم
لۆمەم مەکەن
لە تەوافی هیواکانما
گیانم داوە...
٧٤/١٢/١٢ نیوەشەو

١ـ باورێکی کۆنە دەڵێن هەر کچێ دەستی بە کۆلکە زێڕینە بگا دەبێ بە کوڕ.

«تو کێی»

ئەتۆ کێی وا،
بە شەپۆلی وشەی بیرۆز
دڵمت هەژاند!؟
لە خەوی سارد و نامۆدا
هەستی ئاڵۆزمت راپەڕاند؟
تریفەی کەمەندی نیگات
لە ئاسۆی بیرەوەریمدا
هێڵی هیوای ژیانمی نەخشاند؟
ئەتۆ کێی وا!؟
لە ئاسمانی ئەشقی بیرۆز
ڕێژنە بارانی وەفات
بەسەر لەشی ژاکاو و ماندوما باراند؟
لە خەرمانەی تریفەی مانگ
چەپک چەپک
بۆنی عەتری
مێخەک و سمڵ و ریحانەت
بە ناو دەرونمدا پڕژاند؟
دە پێم بڵێ!
فریشتە خوو، بەسیە رامان
دەبا!
لە رانەوەی پر پرە و پەرەنگی گوارەت
ئاهەنگی لێدانی دڵ بێ
دەلێگەرێ:
سێحری تریفەی
پیکەنینت

ئاوێتەی گیانی ماندوم بێ
دەلێگەرێ!
با پارێزگای ئەوینەکات
جێی حەسانەوەی هەرێمی ژیانم بێ
٧٥/٧/٢٢

«لە دایک بوونێکی نوێ»

دەستی بیر بۆ پێنووس دەبەم
لە بەر تەوژمی ئیش و ئازاری دەروون
لاڵ و واڵە
نایمتە گۆ
زمانی شەتەک دراوم
ویشک و بێ هیوایە قەڵەمی شکاوم
دڵۆپ، دڵۆپ،
فرمیسکی چاوگەی ئەوین
بە سەریا دەرژێ و
لەشی ساکار و زەرد هەڵگەراوی
تین و گڕی تێدە گەڕێ
راستە هەموو ئەندامی بیر
لە سەر سکڵی ئەوینی تۆ
قرچ، قرچ ئەبرژێ، ئەسووتێ
بەڵام کوانێ؟
کوا ئوخژنێ؟
میوانی ساتێکی
دڵی پڕ لە خورپەم دەبێ؟
ئاخ... کە چەندە بێ ئوقرەیە
هەڵۆی کوێستانی،
بەرزی یادت
بەر دەشت و نشێو و چیا و رووباری
هیوامانا
بۆ داهاتوو یەکی رووناک

بالّی بدات
وەرە با لە ئامێزی مێژوودا
ژوانی تریفە و پێکەنین
بکەینە گەڕی رەشبەڵەک
با ئاهەنگی
لە دایک بوونێکی نوێ
سەر چۆپیمان بۆ بکێشێ!
٧٥/١١/١١

«بروسکەی هیوا»

قەڵەمی بیرم ناتوانێ
ئاوێزانی لاپەڕی بیرەوەری بێ و
چەند لاپەڕەیەک پڕکاتەوە
لەبەر ئەوەی.
هەر بە تەنیا
ئەوینی پیرۆزی تۆیە
گشت لاپەڕی ژینمی پڕکردۆتەوە
هۆ فریشتەی سەر دوندی هیوا
چاو لەبەرتا شەوارەیە
بروسکەی بە هێزی نیگات
دڵی پڕ لە حەز و تاسەم دەمەژێنێ
کە بە چاوی ئەوینەوە
کاتێ سەیری دیمەنی ئاهۆرات دەکەم
لە خۆشیانا
جین ، جین
بەستەی سەوزی دڵم
بۆ بێستانی ئەشقی پاکت
دەهۆنمەوە.
٧٥/٩/١٦

«ژانی شوکرانه»

له سەر لێوم وشەی شوکر چە کەری دا
بە فرمێسکم لە نێو کێڵگەی شۆەکاتا
نەمامی شێعر سەوز بوو
بیری کاڵم، لە سەر سینگی دەریاکان و
بەرۆی ئاسمان
وێڵ بێت و دەخولێتەوە،
بە برووسکەی بیرێکی نوێ، ژان دەیگرێ
لەچی بدوێم؟
لە ڕێباز و پێبازانا سەنگرێ هەڵم دەگرێ
کە زریانی وەشیوومە دڕ
لە نێو ژانی دڕک و گڕا،
لە سەخڵەت و سەرمای ژینا شکاندوویە
لک وپۆپی داری هیوام.
بەرە بوون هەنگاو نانێم
چونکا ئەمن
لە ژوانی ئاواتە لەمێژهینەکانی
مێژوودا بە زارۆکی فرچکم گرتوە؛
گەلی شوکرانە بژیرم
پاکی و ڕاستی لە دەرونمال جێی گرتووە.
٧٥/١/٢٤

«ڕۆژنامەی شۆڕشگێڕ»

لە کاتێکا موسەلسەل وە قرمە کەوت
مەرگ ڕو بە ڕوم دانیشتبوو
لەو بەری مێزی ڕاوێژ«چ دەبێ بکرێ و چلۆن»
نموونە چاپ کراوەکانی بە مێشکما هات؛
«ئەی بۆ هەڵ ناسیتە سەر پێ؟
مەگینە بڕیار وایە
خوێن بێ و
چەرخی چاپخانە
هەڵسوڕێنێ»

پایزی ٧٥

«بونلسۆن ساندلا»

تۆ لەو بەری زەوی
لە ناورکەی ئاگراویت
منیش لێرە
هێڵی پەیوەندمان دوور لە خەوشی زەمانە
کەمترین مەودای جیهانە
دەستی متمانە درێژ کە بۆ لام
ئەی جیرانی دەرد و پەژارە
لە ژێر قەمچی دڕی بادا
لەمپەری شەمی لەرزانی
سرود وێژی ستایشێکی لە بیر چوین
لە هۆنراوەی لاوازو کورتا
نەک هەر تۆ
فیداکار و بێ بەشی.

«ماسی»

وەبیرم نایە قەت ئاوا بوو بێ دڵی من
بەم چەشنە
گەرم و سوور
وا هەست دەکەم
لە درێژترین ساتەکانی ئەم شەوە مەگبارەدا
هەزاران کانیاوی خۆری بڕوایم
لە ناو دڵدا هەڵ دەقوڵێ
وا هەست دەکەم
لە هەر سوچ و قوژبنێکی ئەم شۆرەکاتی ناهومیدیە
هەزاران لێڕواری گەشاوە
لە نەکاو دەڕوێ

ئاخ ئەی بڕوای ون بوو،
ئەی ماسی رەوەکی لەدەس دەرچوو
کە توێ تۆی
لە تاڵاوی ئاوێنەی خزاوی
من ئاو روون کەرەوەم
ئەوا بە سبحری ئەوین
لە تاڵاوی ئاوێنە ڕا
شێلەگەیەک بۆ من هەڵبەستە

وەبیرم نایە قەت ئاوا بوو بێ

دەستی من
بەم چەشنە گەورە هەراو
وا هەست دەکەم
لە چاوانی منا
- بە تکە فرمێسکی خوێنین
سرودی هەتاوی بێ ئاوا بوون
وەگیان دێ
وا هەست دەکەم
لە هەرە ماریکمدا
لە هەر جارە لێدانێکی دڵمدا
ئێستا:
زەنگی وەڕێ خستنی کاروان لێدەدا

شەوی رووتەڵەم هاتۆتە ژوور
هەروەکو رۆحی ئاو
دوو ماسی لە سینگی‌دا و ئاوێنەیەک بە دەستێوە
زولفە خاوەکانیشی خەزە بوون و
وەکو خەزەش لێک هاڵا و
لە بەر دەرکی ناهومێدیا لە بانگم دا
ئاخ ئەی بە بڕوا گەیشتوو
تازە دات نانێمەوە.
زستانی ٧٤
«باخی ئاوێنە»

چرایەک بە دەستمەوە، چرایەک لە ڕوو بە ڕوم
دەچمە شەڕی تاریکایی

بیشکەماندۆکان
لەگەرما و گەرمی ڕاژاندنا
وێستاون
هەتاویکیش لە ناخەوە
پشکۆی هەمو کاکەشانە سووتاوەکان
دەگەشێنێتەوە

هاورە سەرکەشەکانی بروسکە
ئەو کاتەی کە تەرزە
لە ناخی بێ ئارا و قارای هەورا
گەرا دەکا
ژانی دامرکاوی دارە مێویش
ئەو کاتەی کە وردە قۆرە
لە جەم سەری لقە درێژ و پێچ خواردۆکانەوە
چرۆ دەردەکا
هاواری من لە هەمو ڕا کردن لە کوێرەوەری بوو
چوونکە لە سامناکترین شەوەکان دا
داماوانە
بۆ خۆر پاڕامەوە
تۆ لە خۆر و کازێوەکانەوە هاتووی
تۆ لە ئاوێنە و هاوریشمەکانەوە هاتووی

لەو شوێنە خاڵیەیی کە نە خودا بوو نە ئاگریش
بۆ نیگا و براوی تۆ

داماوانە دەپاڕامەوە
ڕەوتێکی ڕاستەقینە
لە مەودای دوو مەرگ و
لە کلۆری نێوان دوو تەنیاییدا
(ئابەم جۆرەیە نیگا و بڕاوی تۆ)

شادی تۆ مەزن و بێ بەزەیە
نەفەست لەدەستە خاڵیەکانی منا
سەوزە و گۆرانین
من هەڵدەستم
چرایەک لەدەستمدا
ژەنگ و ژاری ڕۆحمی بێ دەسووم
ئاوێنەیەک لە بەرابەر ئاوێنەکەت دادەنێم
تا بێ بڕانەوەیەک
ساز کەم لە تۆ.

زستانی ٧٤
«سرودێ بۆ رێز و خۆشەویستی»
ماچەکانت
مەلی بە جریوەی دارسانن
مەمکەکانیشت پوورە هەنگی کوێستانەکان
لە شیشت رازێکی هەرمانە
کە لە چۆڵگەبەکی مەزن دا
بۆیان هێناوە مەدی
لەشی تۆ ئاهەنگێکە و

لەشی منیش وشەیە، تێی دەگەڕێ
- تا بەستە بێتە گیان،
سرودێ کە بەردەوامی دەخوازێ
لە نیگات هەمو مێهرەبانێک بەدی دەکرێ
قاسیدێ کە هەواڵی ژیان دێنێ.
لە کپ برونشیت هەمو دەنگێ
هاوارێکە «بوون» ئەزموون دەکا.

«خۆشه ویستی»
لەو پەڕی سنووری لەشتا خۆشم دەوێی
شەراب و رووناکی و
ئاوێنە و چەکچەکیلە تامەزرۆکانم پێ بدە
ئاسمانی بەرزو کەوانەی بەرینی پرد
باڵندەکان و کۆلکەزێڕینەم پێ بدە ...
لەو پەڕی سنووری لەشمەوە
خۆشم دەوێی
دەستم پێت راناگا
لەئەوپەڕی دورییەوە
پەیامبەری لەشەکان کۆتایی دێ
گڕ سۆزی بێ ئۆقرەیی و
ویستەمانمان بە تەواوی
دەنیشنەوە
لە ئەو پەڕی ئەوینەوە
خۆشم دەوێی
لەوپەڕی پەردە و رەنگەوە
لەئەوپەڕی جەستەی هەردووکمانەووە
بەڵێنی ژوانێکم پێ بدە

«کاروان»

پیش آ!

ای ناز فرشتهٔ طوفان

که در چشمانت غبار و ماتم غم انگیزی

سنگینی می‌کند.

پیش آ...

که دنیا برایم یم اندیشهٔ بی انتهاست

در لابه‌لای جادهٔ پر پیچ و خم زمان

اشک یتیمان زخمی تشنهٔ لب است

همچو طوفان و گردباد مرگ آور

بر سکان فرسودهٔ زمان

هر دم می‌کوبد.

هر بار سرنشینانش را با در جانکاه و سوز،

با ناله‌های در گلومانده

که با سمفونیای دنیای نو

در نی چوپان سالخوردهٔ زمان

با پیکر هراسان از ظلم

بیشتر می‌دمد و

چشم در راه کاروان است،

صبح فرا می‌رسد.

آه!

که چه جانسوز است

غم و اندوه بر کاروان.

پیش آ!
ای فرشتهٔ کاروان
ابر سیاه و تیره
بر آسمان کبود فایق است،
بارانی می‌خواهد بی انتها
سیراب کند زمین تشنه را.
۷۰/۸/۱۶